# زۆرلێ کردن

# و

# مەرجەکانی

لە نوسینی :

أبو عاهد ( تقبله اللّه )

بسم الله الرحمن الرحيم
الحمد لله وحده ، والصلاة والسلام على من لا نبي بعده

∮ إكـــــراهـ ∮

بەشــی یەکـەم :

الإكراهـ و شروطه ـــ زۆرلێكردن و مەرجەكانی :

پێناسەی الإكراهـ :
بریتییە لە نارەحەتی و بێتاقەتی و زۆرلێكردن ، بێجگە لەو شتانەی كە خۆت حەزت لێیەتی ، وەكو خۆشەویستی و ئیجباری .

إبن حجر ( ڕەحمەتی الله ـی لێ بێت ) دەفەرموێت :
پابەند بوون بە شتێک كە تۆ ناتەوێت و حەزی پێناكەیت .
( فتح الباري 33/8 )

مشروعية الإكراهـ ـــ ڕێگە پێدراوەكانی زۆرلێكردن :

چەسپاوە لە كتابی الله تعالی كە درووستە و ڕێگە پێدراوە ووتە و كردار ( قول ، فعل )ـی كوفر لەژێر إكراهـ ـدا ، ئەگەر مەرجەكانی إكراهـ تێدا بێتە دی ،
ئەسڵ لەم ئایەتە بۆمان ڕوون دەبێتەوە :

{ مَن كَفَرَ بِاللّهِ مِن بَعْدِ إيمَانِهِ إِلاَّ مَنْ أُكْرِهَ وَقَلْبُهُ مُطْمَئِنٌّ بِالإِيمَانِ وَلَـكِن مَّن شَرَحَ بِالْكُفْرِ صَدْرًا فَعَلَيْهِمْ غَضَبٌ مِّنَ اللّهِ وَلَهُمْ عَذَابٌ عَظِيمٌ }
[ سورەتی النحل ـ 106 ]

واتە : ئەوەی پاشگەز بێتەوە لە خـودا ناسی ، دوای باوەڕهێنانی ،

جگە لەوانەی کە ناچار دەکرێن وشەی کوفر بێت بەسەر زاریاندا لە کاتێکدا دڵیان پڕە لە ئیمان ، بەڵام ئەو کەسەی دڵی بە کوفر و بێ دینی خۆش کردبێت ، ئەوانە خەشم و قینی خـودایان لەسەرەو سزای گەورە و سەخت و دژواریان بۆ هەیە .

مەشهورە کە سەبەب نزولی ئەم ئایەتە لەسەر ( عمار بن یاسر ) دابەزی هەروەکو أبو عوبیدەی کوڕی محمد کوڕی عمار بن یاسر لە باوکیەوە دەگێڕێتەوە و دەفەرموێت :

(( اخذ المشركون عمار بن ياسر ))

موشریکەکان عمار بن یاسریان گرت و وازیان لێنەهێنا هەتا قسەی بە پێغەمبەر ( صلى اللّٰه عليه وسلم ) نەوت و باسی ئیلاهەکانی ئەوانی بە چاکەکرد ، ئینجا بەریاندا و گەڕایەوە بۆلای پێغەمبەر ( صلى اللّٰه عليه وسلم ) پرسیاری لێکرد چیـــبوو ؟

عمار بن یاسر ووتی : وازیان لێنەهێنام تا قسەم بەتۆ نەوت و باسی ئیلاهەکانیانم بە چاکە نەکرد ،
پێغەمبەر ( صلى اللّٰه عليه وسلم ) فەرمووی ئەی دڵت چی دەڵێ ؟
عمار بن یاسر وتی : دڵم پڕە لە ئیمان ،
پێغەمبەر ( صلى اللّٰه عليه وسلم ) فەرمووی :
ئەگەر هاتنەوە دووبارە وابڵێ .
(( رواه بيهقى في سند الكبرا فهو صحيح السناد ))

ئیمامی حافظ بن حجر ( ڕەحمەتی اللّٰه لێ بێت ) دەفەرموێت :
هەموو عولەمایان ڕایان وایە (( متفیقن )) بەبێ خیلاف کە ئەم ئایەتەی سورەتی النحل ( 106) لەسەر عمار بن یاسر دابەزیوە .
[ كتاب إبن حجر : الاصابة 512/2 ]

⋆ شـــروط الإكـــراه ـــــ مــەرجەکانی زۆرلێکردن :

هەرکاتێک یەکێک لەم مەرجانەی باسیان دەکەین لەسەر إکراهـ نەیەتەدی پێی ناوترێت إکراهـ بەڵکو پێی دەوترێت کـــوفـــر .

① دڵ ئارام بێت بە ئیمان .

ئیمامی إبن جوزی دەڵێت :
دڵ ئارام بێت و ڕازی بێت پێی .

قتادە دەڵێ :
پێغەمبەر ( صلی اللّٰه علیه وسلم ) پرسیاری لە عەماری کوڕی یاسر کرد لەبارەی دڵیەوە وتی : دڵم پڕە لە ئیمان ، ئەگەر وای نەوتایە ئەوە مەرجێک نەبو لە مەرجەکانی إکراهـ لەبەر ئەوە پێغەمبەر ( صلی اللّٰه علیه وسلم ) پرسیاری لێکردووە .

إبن بطل دەفەرموێت :
إبن المنزير ئیجماع ـمان بۆ نەقڵ دەکات دەڵێ :
هەرکەسێک إکراهـ بکرێت لەسەر وتنی کوفر ئەگەر ترسا لەوەی بیکوژن ، وە کوفری کرد بەڵام دڵی پڕبو لە ئیمان حوکمی لەسەر نادرێت بە کوفر و ژنەکەشی لێ جیاناکرێتەوە .
( فتح الباري 12/314 )

بەڵام هەرکاتێک دڵی خۆش بوو بە کردنی ئەو کوفرە و دڵی ئیسراحەتی کرد ، ئەوە پێی کافر دەبێت لەبەر قەولەکەی اللّٰه تعالی ، مادام دڵی خۆشە بەو کوفر کردنە ئەوا پێی کافر دەبێت و لە مەرجەکانی إکـراهـ دەردەچێت .

ئیمامی شەوکانی دەڵێ :
ئەگەر بیروباوەڕی وابوو یان دڵی پێکرایەوە ئەوە یەکسەر کافر دەبێت .

( فتح القدير 3/196 )

② دووەم

ان يكون الإكراه ملجا ــ دەبێت إكــراهـ كە زۆر بەهێزبێت :

مەرجە ئەگەر هەڕەشە بکەن لە خاوەنەکەی بە کوشتن یان شکاندنی ئەندامەکانی جەستەی وە هیچ دەستەڵاتێکیشی نەبێت وە بە کەیفی خۆشی نەبێت ، هەروەکو چۆنە هەڕەشەی کوشتن بکەن لێت یان لە دەستدانی یەکێک لە ئەندامانی جەستەت وەک قاچ ، دەست ، یان لێدانێک کە خەریک بێت بتکوژێت ، وە گومانت وابێت کە ئەو هەڕەشانەی دەیڵێن جێبەجێی دەکەن لەسەرت ، ئەوکاتە درووستە ئەوەی پێتەڵێن بیکەیت ، ئەوە هەمووی دەبێتە بەشێک لە نارەحەتی و عەزاب وەکو چۆن عەمار بن یاسر ئەو مەرجانەی تێدا هاتەدی دایک و باوکیان کوشت لە بەرچاوی بۆیە إکــراهـ کەی لێ وەرگیرا ئەگەر وای نەوتایە ئەوە ئەویشیان دەکوشت .

إن شاء اللّٰه لە پۆستێکی تردا خاڵەکانی تریش بەیانەکەین ...

*******************************************

∮ إكـــــــراهـ ∮

بەشــی دووەم :

③ ( مەرجی ) سێیەم :

دەبێت إکــراهـ کە تەواو کامل بێت ئەمەش بە دوو مەرج دێتەدی :

1- نەتوانێت بە قسە بیان خەڵەتێنێت و لەسەر خۆتی لابەیت .

2- توانای ڕاکــڕدنت نەبێت .

هەروەکو چۆن عمار بن یاسر توانای ڕاکردنی نەبوو وە توانای گۆڕینی إکــراهـ کەشی نەبوو بە قسە .

④ چـوارەم :

( أن يكون الا اكــراه على فوز )
دەبێت إکــراهـ کە ڕاستەوخۆ بێت ( یەکسەربێت )

بە جۆرێک بێت کە بۆ نموونە نەڵێت دەڕۆم و دوایی دێمەوە ، لەبەر ئەوەی عمار بن یاسر پێیان ووت : ئەگەر ئێستا نەیڵێت یان نەیکەیت دەتکوژین .

⑤ پێنجەم :

( أن يكون الا إكــراه لازما )
دەبێت إکــراهـ کە بەس بۆخۆت بێت .

نابێت زەرەری بۆ غەیری خۆت هەبێت ، وە عمار بن یاسر کاتێک إکــراهـ کەیانکرد إکــراهـ کرا لەسەر نەفسی بەس تەنها بۆ خۆی بوو ، هەتا عولەمایان دەڵێن إکــراهـ زەرەری بۆ خەڵکی تر هەبێت هەتا ئەگەر بۆ غەیری کوفریش بێت نابێت ، ئەوە بۆ کفر هەر نابێت .

ئیمامی قورطوبی دەفەرموێت :
هەموو عولەمایان لەسەر ئەوەن ئەگەر إکــراهـ لەسەر کەسێک بکەن بۆ کوشتنی کەسێکی تر ، ئەوە درووست نییە وە یان ئیهانە بە

ناموسی بکات بە لێدان ، یان بە هەرشتێکی تر درووست نییە بەڵکو دەبێت صەبر بگرێت لەسەر بەڵاکە .

( تفسير قورطوبی ) وە ئیمامی ابن اغربی ، ئیمامی رجب ، إبن القيم ، إبن تيمية ، لەسەر ئەم ڕاو بۆچوونەن .

ئیمامی إبن رجب دەفەرموێت :
ئەگەر کوشتی لەو حاڵەتە جمهور دەفەرمون : شەریکن لەو کردارە کە کردوویانە بەرامبەر ئەو کەسە ، وە تۆڵە واجب دەبێت لەسەر زۆر لێکراو ، زۆر لێکەر ( المنكره ، النكير ) کە بەژدارن لە کوشتنی ئەو کابرایە ئەم قەولە مەشهورە لەلای ئیمامی شافعی ، ئیمامی أحمد ، ئیمامی مالک .

تێبینی ///

إکـــراهـ ڕوخسەت نەبوو بۆ ئومەتانی پێش خۆمان .

وەک چۆن دوو پیاو ڕۆیشتن بەلای پەرستگایەکا کاتێک دەستگیریان کردن پێیان وتن لێرە ناڕۆن هەتاوەکو خۆتان نزیک نەکەنەوە بەشتێک بە یەکێکیان ووت : خۆت نزیک بکەرەوە ، وتی هیچم نییە بەچی خۆم نزیک بکەمەوە ، وتیان خۆت نزیک بکەرەوە بەسەر بڕینی مێشێکیش بێت ، وتی من هیچ سەرنابڕم بۆ غەیری اللّٰه تعالی ، کوشتیان و چووە بەهەشتەوە ،
دووەمیان وتی من هیچم نییە هەتا نزیک ببمەوە ، وتیان خۆت نزیک بکەرەوە ئەگەر بە کوشتنی مێشێکیش بێت مێشەکەی سەربڕی لەژێر إکـــراهـ دا بەڵام لێی قبوڵ نەکرا .

ئا لێرە بۆمان ڕوون دەبێتەوە کە ئومەتەکانی پێش خۆمان لە حاڵەتی إکــراهـ دا نەیان توانیوە إکـــراهـ هەڵبژێرن ، چونکە ڕەوا نەبووە بۆیان ئەگەر ڕێگە پێدراو بووایە ئەوە کەسی دووەمیش لێی

قبوڵ دەکرا .

⑥ شەشەم :

( أن يكون المكره قادر مطيعا )

دەبێت ( مكره ) ئەو کەسەی کە زۆرلێکردنەکە دەکات بە توانا و دەستەڵات داربێت چونکە بەڕاستی ڕوداوەکەی عمار بن ياسر لە ژێر إکــراهـدا بوو ئەو کەسانە دەستەڵات و توانایان هەبوو لە پێش عمار دایک و باوکیان کوشتبوو ، لەبەر ئەوە زۆربەی گومانی وابوو ئەگەر بە قسەیان نەکات دەیکوژن .

هیچ کەس بۆی نییە وتەی کوفری یان کردەوەی کوفری بکات ئەگەر لە ژێر إکــراهـدا نەبێت .

⑦ حەوتەم :

( أن يكون في موالات الكافرين )

دەبێت إکــراهـ کە نەبێتە خۆشەویستی دەربڕین بۆ کافرەکان ، وەکو جاسوسی کردن و مەسڵەحەتیان ، یان چوونە ناو پەڕلەمانیان وە یارمەتی دانێک کە ببێتە هۆی سەرکەوتنییان ئەمە لە ئەصلی خۆی لادەدات کە إکــراهـ بێت ، وە عوزریش نییە لەم خاڵانەی باسمان کرد لەبەر ئەوەی ئیشەکەی عمار بن ياسر نەبووە هۆی خۆشەویستی کافر ، بەڵام زەرەرەکەی بۆخۆی بو .

هەروەکو چۆن پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) لە ڕۆژی بەدرـدا عەباسی مامی کە بە دیل گیرا فیدیەی لێ وەرگرت کە بە دیل کەوتە بەردەستی موسڵمانان هەرچەندە عەباس موسڵمان بوو بەڵام بە زۆر هێنرابوو بەڵام پێغەمبەر ( صلى الله عليه وسلم ) فەرمووی :

ظاهیرت حیساب دەکەین بەڵام نهێنیەکەت لای اللّه ـیە ، پێغەمبەر ( صلی اللّه علیه وسلم ) نەیفەرموو : ئەوە إکـــراهـ بۆ عەباس .

⑧ هەشتەم :

( أن لایرد علی ما إکــراه علیه )

نابێت زیادەڕەوی لە إکـــراهـ ـدا بکرێت إکــراهـ شتێکی پێش هاتووە دەبێت مامەڵەی ناچاری لەگەڵدا بکرێت ، هەروەکو چۆن گۆشتی بەراز حەڕامە درووست نییە خواردنی گۆشتەکەی إلا لە زەڕوڕەتدا نەبێت ئەویش دەبێت بە شێوەیەک لێی بخورێت بە گوێرەی پێویست ، وە حەڕامە زیادە بخورێت هەروەکو چۆن زیادەڕەوی بکەیت لەسەر ئەو کوفرە کە إکـــراهـ ت دەکەن لەسەری ئەگەر زیادەت کرد دەبێت بە کوفر ، لەبەر ئەوەی داوای لەوە زیاترت لێ نەکراوە ئەگەر زیاترت ووت لەوەی داوایان لێکردویت لە قاڵبی إکـــراهب دەردەچێت چونکە عمار بن یاسر لەوە زیاتری نەوت کە داوای لێکرا .

( با زیاتر درێژ نەبێتەوە إن شاء اللّه لە پۆستێکی تردا باسی ئەو مەسەلانە دەکەین کە پەیوەندیان بە إکـــراهـ ـەوە هەیە )

********************************************

[ عـــەظیمەت و ڕووخســـەت ]

∮ إکـــــراهـ ∮

بەشی ســێــیــەم ، کـــۆتــایی :

ئەو مەسەلانەی پەیوەندیان بە کراهـ ـەوە هەیە :

**پرسیار ① /**
**ئایا هەڕەشە و ترساندن بە تەنها بە إکراهـ حسابە ؟؟**

**وەڵام /**
**خیلافی زانایانی لەسەرە .**

**أـ جمهوری عولەما لەسەرووی هەموویانەوە شێخی ئیسلام إبن تیمیة و تەلەبەکەی إبن القیم دەفەرموون :**
**بەڕاستی هەڕەشەکردن بە تەنها پێی ناوترێت إکراهـ لەسەر کوفر ، بەڵام دەبێت بە إکراهـ لە غەیری کوفر ، وە بەڵگەش لەسەر ئەمە هاتووە لە بەسەرهاتی عمار بن یاسر کە هەڕەشەی لێکراو بە کردەوەش بینی ،**
**وە لە ڕیوایەتێکی تردا هاتووە کە سەری عمار ـیان کرد بەناو ئاوداو دەریان دەهێنایەوە ، وە ئیمامی أحمد تەئکیدی دەکاتەوە کە زۆر لێکردن لەسەر کوفر بە إکراهـ دانانرێت ئەگەر ئازاردانی لەگەڵدا نەبێت بە لێدان .**

**ئەوە نابێت بە إکراهـ هەروەکو چۆن کەسێک لە سجن بێت بترسێت لە کافرەکان ئەگەر پێی بڵێن دەبێت ژنەکەت تەڵاق بدەیت ، دەتوانێت ژنەکەی تەڵاق بدات بەڵام بۆ کوفر نابێت .**

**هەروەها شیخ الإسلام إبن تیمیة ( رحمه اللّٰه ) دەفەرموێت :**
**فەرق دەکات بۆ کوفر و غەیرە کوفر ، بۆ کوفر درووست نییە ، بۆ غەیری کوفر ترساندنیش إکراهـ**

**( ئەمە قەولی راجحە )**

**ب / ترساندن بە تەنها إکراهـ لەسەر ئەوەی کوفر بێت یان غەیری کوفر بێت ، ئەمەش قەولی ( أحناف ، هەندێک لە شافعیەکانە ....**

وه ئیمامی مالک دەفەرموێت :
هەڕەشە لێکردنی ترسناک إکراهـ ئەگەر ڕووش نەدات وه ئەگەر ڕووش بدات ئەوە هیچی لەسەر نامێنێت .

( تفسیر القرطوبی ـ م ١٩٠ س ١٠ )

ڕەئی ڕاجح قەولی یەکەمە لەبەر ئەوەی دەلیلەکەیان باسی عمار بن یاسر دەکات لەبەر ئەوەی إکراهـ کەی عمار تێکەڵ بوو بە هەڕەشە و لێدان وە هیچ دەلیلێک نییە قەولی یەکەم ڕەت بکاتەوە .

پرسیار ② /
ئایا دەبێت وتەی کوفر یان کردەوەی کوفر بکەین بە سەبەبی إکراهـ یان صەبر گرتن باشتر و چاکترە ؟

وەڵام /
دەست گرتن بە عەظیمەتەوە زۆر باشترە لە دەست گرتن بە ڕوخسەتەوە ...

وەکو چۆن دایک و باوکی عمار دەستیان گرت بە عەظیمەتەوە و پێغەمبەر ( صلى الله علیه وسلم ) پێی فەرموون : ( خۆڕاگربن ئەی ئەهلی یاسر دیدارمان بەهەشتە ) .

بەڵام عـمار دەستی گرت بە ڕوخسەتەوە و الله تعالى لێی قبوڵ کرد ، بێگومان بەڕاستی بەهەشتی الله تعالى گەورەترە و بەڕێزترە لە ڕوخسەت .

وه هەروەها ئیمامی إبن کثیر ( رحمه الله ) دەفەرموێت :
هەروەکو چۆن موسەیلەمەی کەزاب دوو کەسی گرت داوای لێکردن دان بنێن بە پێغەمبەری مندا ، ئەوەبوو یەکێکیان وتی : من

تۆ ناناسم و کەرم لە ئاستی ئەو قسەیەی تۆ کردت ، دووەمیش ڕوخسەتی هەڵبژارد .

ئەوەبوو پێغەمبەر ( صلى اللّٰه عليه وسلم ) فەرمووی :
یەکەمیان ڕۆیشت لەسەر ڕاستی و عەظیمەتی هەڵبژارد موژدەی بەهەشتی پێبدەن ، وە دووەم کەس کە ڕوخسەتی هەڵبژارد اللّٰه تعالى ڕوخسەتی لێ وەرگرت .

ئیمامی إبن بطال دەفەرموێت :
کۆدەنگی لەسەرە هەرکەسێک زۆری لێ بکرێت لەسەر کوفر وە کوشتنی هەڵبژارد ئەوە پاداشتی زۆر لەو کەسە زیاترە کە ڕوخسەتی هەڵبژارد .

( فتح البارى ـ ٣١٧/١٢ )

ئیمامی الحربى دەفەرموێت :
بەڕاستی کوفر لەکاتی إکراهـدا درووستە لەلای عولەمایان ، بەڵام ئەگەر صەبر بگرێت لەسەر نارەحەتی و ئازارەکەی وە تووشی فیتنە نەبێت هەتاوەکو دەکوژرێت ئەوە شەهیدە و خیلاف نییە لەلای عولەمایان لەسەر ئەمە .

[ نوسینی : أبو عاهد ، والی ویلایەتی دیالە ، تقبله اللّٰه ]

تم آخر تعديل في: ٦:٠٢ م